# ناوەڕۆک

## پێشەکی

مێژوونوسێکی بەناوبانگ چل ساڵ لەمەوبەر نووسیبووی: "زۆربەی خەڵکانی ئەفریقا خاوەن مێژوو نین." ئێستاش سەدان هەواڵدەری مێژوویی سەرقاڵی لێکۆڵینەوە و خوێندنەوەی مێژووی کیشوەری ئەفریقان. هاوکات لەگەڵ ڕووکردنە کیشوەری ئەفریقا واتە لە نیوەی دووەمی سەدەی نوزدەهەم، ئەوروپاییەکان دانیان بە مێژووی ئەفریقادا نەدەنا. ئەوەش لەبەرئەوەی ئەو سەردەمە ئەوروپای رۆژئاوا، سێ سەدە لەسەر یەک تەجرەبەی زانستی و گۆڕانکاری گەورەی لە بواری پیشەسازیی بە خۆوە دیبوو کە ئەفریقا ئاشنا نەبوو بەم گۆڕانکاریانە. بە وتەیەکی دیکە ئەوروپاییەکان بە پێوەرەکانی خۆیان داوەریان لەسەر ئەفریقا دەکرد. دەیانهەویست شێوازی ژیان و شارستانیەتی خۆیان بە سەر خەڵکی ئەفریقادا بسەپێنن. لەم نێوانەدا تەنیا ڕێژەیەکی کەم لە ئەوروپییەکان هەبوون کە پرسیارێکیان دەوروژاند و پرسیارەکەش ئەمە بوو: **"ئایا باوەڕکردن بە ئەفسانە و جادوو دواکەوتویی و ناشارستانیەتییە یان کوشتنی سەدان هەزار مرۆڤ بە هۆی چەکە دروستکراوەکانی وڵاتە پێشکەوتووکان؟**

هەمیشە ڕەخنەگرتنی ئەوروپییەکان هاوکات بووە لەگەڵ تێنەگەیشتنیان لە شێوازی ژیانی ئەفریقاییەکان. نێردراوانی مەسیحی ئەوروپا دژایەتی "پولی گامی" یان فرەژنی ئەفریقیەکانیان دەکرد، لە کاتێکدا فرەژنی لە ئەفریقا ڕۆڵێکی گرنگی لە گەشەی خێزان دەبینی. لە ئەفریقا خێزان تەنیا بریتی نەبوو لە دایک و باوک و منداڵ، بەڵکو کۆمەڵەیەک بوون لە باوکان، دایکان، باپیر، داپیر، براکانیان خوشکەکانیان، ژن براکانیان، خوشکەزاکانیان و مامەکانیان. ئەم جۆرە لە خێزان پەیوەندییەکی پتەوی لە نێوانیاندا دروست دەکرد و لە تەنیایی دووری دەخستنەوە و تەنیا ڕێژەیەکی زۆر کەم لە ئەفریقاییەکان تەنیا و بێکەس بوون. لە ئەوروپای خاوەن "شارستانییەت" تەنیایی بەتایبەت بۆ بەساڵاچوان کێشەیەکی گەورە بوو.

بەم جۆرە بوو کە ئەوروپییەکان لە داوەریکردنیان پەلەیان دەکرد. ئێستا دەزانین کە ئەفریقا و خەڵکی ئەفریقا رۆڵێکی گرنگیان لە مێژووی ژیانی مرۆڤە سەرتاییەکاندا هەبووە و هەوەڵین هەنگاوییان بۆ نیشتەجێ بوون ناوە. کۆنترین بوونەوەران کە بە باوانی مرۆڤ لە قەڵەم دەدرێن لە ڕۆژهەڵاتی ئەفریقا ژیاون. توانای مرۆڤ لە دروستکردنی کەرەستە و ئامرازە کە وا دەکات مرۆڤ لە پێشتر  پێشکەوتووتر بێ و تا ئەو جێگایەی دەزانین کۆنترین مرۆڤەکان کە ئامرازییان دروست کردووە، لە کینیا و تانزانیا ژیاون. هەندێک ئامرازی کۆن وەکوو تەوری جەنگی لە چاو هەر شوێنێکی دیکە لە ئەفریقا زیاتر بەرچاو دەکەوێ و هەر لەبەر ئەمەشە کە دەڵێن ئەفریقا لانکەی مرۆڤەکانە.

سەرزەوی و هەرێمەکانی ئەفریقا

## جوگرافیای ئەفریقا

ئەگەر بمانهەوێ بە مێژووی ئەفریقا ئاشنا بین دەبێ چاوێکیش لە جوگرافیای ئەو کیشوەرە بکەین. بەشی زۆری ئەفریقا دابەش دەبێ بۆ سێ ناوچەی جیاواز کە ئاو و هەواو ڕووەکی جیاوازی هەیە: یەکەمیان بیابانی "سەحرا"یە لە باکوور و بیابانی "کالاهاری" لە باشووری ڕۆژئاوای ئەفریقا. دووەم دارستانەکانی ناوچەی هێڵی ئیستیوای ئەفریقایە کە بارودۆخی هەرێمی وەکوو بارودۆخی ناوچەیی بیابانەکانە. گەورەترین ناوچەی دارستانیی ئەفریقا ڕوبەرێکی فراوان دەگرێتەوە؛ بەشێکی دەکەوێتە کەناراوەکانی "گینە" و لە بەشی ئەفریقای رۆژئاوا و روباری "کینگۆ" واتە لە کەناراوەکانی زەریایی ئەتڵەسی تا دەریاچەکانی ئەفریقای ڕۆژهەڵات درێژ دەبێتەوە. سێهەم دەشتەکان و ناوچە بە پیتەکانن کە درەختی کەمە و روبەرێکی فراوانی گرتۆتەوە.

زۆربەی زەوییە کشتوکاڵییەکانی ئەفریقا دەکەونە ئەم ناوچەیە. بە هۆی ئاسانی کۆچ کردن و لەبەر بەپیتی خاکەکەی، هەمیشە زۆربەی خەڵکی ئەفریقا لەم ناوچەیە نیشتەجێ بوونە. هەوەڵین بار لەم ناوچەیە بوو کە بازرگانی سەریهەڵدا. بەشێکی گەورەی ئەفریقا لە باشوری هێڵی ئیستیوا تەختاییە کە نزمترین ئاستی ئەو ناوچەیە ٣٠٠٠ پێ لە سەر ڕووی دەریاوە بەرزە. لێوارە تیژەکانی ئەم تەختاییە ڕێگرە لە جەرەیانی ئاوی دەریاکە و ئارامی ناوچەکەی پاراستوە و بۆ کاری کەشیتوانی زۆر لەبارە. بە هۆی بەرزی ئەم ناوچەیە، زۆربەی ناوچەکانی هێڵی ئیستوایی ئەفریقا زۆر گەرمە و شێدار نین و هەر لەبەر هەندێ لوتکەی چیاکانی "کلیمانجار" و "کینیا" هەمیشە سپی پۆشن.

رونكردنەوەيەك لەبەر تەختاييەكانی ئەفريقا

دوو یەکتربڕینی قووڵ نیوەی باشوری ئەفریقیای گرتۆتەوە کە لە دۆڵە تەنگەبەرەکانیدا دەریاچە گەورەکانی ئەفریقای لەخۆگرتووە و لە نزیکیشیەوە گڕکانەکانی ئەو کیشوەرەی لێیە. خاکی ئەو ناوچەیە و دەوروبەری لە دەوڵەمەندترین خاکەکانی ئەفریقیان. گەورەترین روباری ئەفریقا واتە روباری نیل جەرەیانەکەی لە باکووری ئەفریقیایە و خرتوخاڵەکەشی بووتە هۆی بە پیتی زەوییە کشتوکاڵیەکانی دەوروبەری. پانتایی ئەفریقا لە کەپکی" ئمیدنیک" تا مەدیتەرانە ٥٠٠٠ میل دەبێ و لە "قۆچی ئەفریقاوە" تا زەریایی ئەتڵەسییش هەر هەمان مەودایە. باریکترین ناوچەی ئەم کیشوەرە لە روژهەڵاتەوە بۆ رۆژئاوا، نزیکەی ٢٠٠٠ میل درێژیی هەیە. تا ئەم سەدەیەی کۆتایی هاتوچۆکردن لە ڕێگەی دەرياييەوە زۆر سنوردار بوو ئەويش بە هۆی نەبوونی ڕووباری لەبار بۆ کاری کەشتیوانی و هەروەها دارستانە چڕەکان و بیابانە لەبن نەهاتووەکان.

## کشتوکاڵ و فلزکاری

لەم نامیلکەیەدا باس لە هەندێ لە وڵاتانی کۆن و ئەو کۆمەڵگایانە دەکەین کە باشترین ڕێکخراوەییان هەبووە و ئەوەش بڵێین کە ئیمپراتۆرەکان و پاشاکانی کۆنی ئەفریقای وەکوو "ئیبۆ" لە نەیجریا و" کی کو یو" لە کینیا بە پێچەوانەی ئیمپراتۆرەکانی دیکەی جیهان سەودای داگیرکارییان لە سەردا نەبووە.

رووکردنە پرۆسەی نیشتەجێکردن و رێکخستنی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی سەرەتا بە فێربوونی کاری کشتوکاڵی و چۆنیەتی سوود وەرگرتن لە کانزاکان دەستی پێکردووە  گەرچی ئەفریقا لە هیچ کام لەم دوو هەنگاوەی ئەوەڵ پێشڕەو نەبووە، بەڵام لە خەڵکانی دیکەی ئەو سەردەمەش وەدوا نەکەوتن. بە ئەگەرێکی زۆر کاری کشتوکاڵی لە ئاسیای رۆژئاوا و لە نزیک " ئەریحا" دەستی پێکردووە کە دەگەڕێتەوە بۆ ٨٠٠٠ پ ز. هەوەڵین جوتیارانی ئەفریقا ٢٠٠٠ تا ٣٠٠٠ ساڵ دواتر کاری کشتوکاڵیان لە نزیک روباری نیل دەستپێکرد. بە پیتی زەویەکانی چواردەوری روباری نیل و لێهاتوویەکی بەشێکی کەم لە جوتیارەکان بە خێرایی کاری کشتوکاڵی بەرەو پێش برد. بە هۆی بەرفراوانکردنی زەوییە کشتوکاڵییەکان و کێڵانی زەویی تازەتر، بووە هۆی بەدەستهێنانی سەرچاوەی نوێی خوراک و ئەمەش جێگای ڕەوشی کۆنی کۆکردنەوەی خۆراکی گرتەوە. بە هۆی پەرەپێدانی کاری کشتوکاڵی،

سەرزەوی پاشاکانی ئەفریقا. لە خوارەوەی نەخشەکەش بەراوەردێکە لە نێوان خاکی هیندستان و ئەفریقا.

گوندەکان و شارەکان دروست بوون و گروپی گەورەتر لە دەوری یەکتر کۆبوونەوە. بە هۆی بەرفراوانبوونی کاری کشتوکاڵی، دەرفەت رەخسا بۆ ئەوەی مرۆڤەکان روو بکەنە کاری هونەر و پیشەوەری و کەرەستەی لە دەست دروستکراو تا ئەوەی کاروباری خەڵکی ئاسانتر کرد. بەرهەمی زێدەبایی بووە هۆی بەدیهێنانی کاری بازرگانی و ڕووبەڕوبونەوە لەگەڵ هزر و کلتوری جیاواز. بەرفراوانبوونی کاری بازرگانی پێویستی بە ئاسایش و پارێزگاری هەبوو، بەم هۆیەشەوە دەوڵەت وەدیهات. میسری کۆن لە ئەفریقا یەکێکە لە درەوشاوەترین شارستانییەتیەکانی جیهان.

دۆزینەوە و سوود وەرگرتن لە کانزاکان پەیوەستە بە سەردەمەکانی دواتری مرۆڤەکان. لە میسری کۆن لە ۳۰۰۰پ.ز سوود وەرگرتن لە زێڕ و مس رمێنی پەیدا کرد؛ بەڵام باشترین کانزا ئاسن بوو کە رۆڵێکی گرنگی لە ئاڵوگۆڕی ژیانی مرۆڤەکان هەبوو کە وا پێدەچێ لە دەوروبەری ۱۵۰۰ پ.ز خەڵکی ئاسیا توانیان ئەم کانزایە کەشف بکەن. دۆزینەوەی ئاسن و سوود وەرگرتن لەم کانزایە بووە هۆی ئەوەی کەرەستە و چەکی بەهێزتر دروستبکرێت، سەرەڕای ئەوەی کە کاری کشتوکاڵی پێشکەوتنی بە خۆیەوە بینی، سوپاکانیش بەهێزتر بوون. هەر لەبەر ئەم هۆیە بوو کە ٦٧٦ پ.ز حکومەتی ئاشوری بە چەکدارکردنی سوپاکەی بە چەکی لە ئاسن دروستکراو توانی بەسەر میسری کۆندا سەربکەوێت.

پاشماوەی شوێنێکی نیشتەجێ بوونی کوش کە 2000 ساڵ پێش دروستکراون

## کوش: سەرزەوی ئاسن

زۆرێک لە فەرمانڕەواکانی میسری کۆن لە ناوچەی "کوش" (کوش دەکەوێتە سودانی ئێستا) لە میسری سەروو سەریان هەڵدا. پایتەختی "کوش" شاری "ناپاتا" بوو و ڕەنگبێ کوشیەکان کاری کشتوکال لە میسرییەکانەوە لە ڕێگای پەیوەندییان لەگەڵ ئاشووریەکان فێر بووبن. لەگەڵ کاری تواندنەوە و سوود لێ وەرگرتنی ئاشنا بوون، لەبەرامبەر میسر کە بێ بەش بوو لە کانی ئاسن و سوود لێ وەرگرتن لەو کانزایە بەپێچەوانەوە کوش سەرچاوەی کانزایی ئاسنی زۆری هەبوو و ئەمەش بووە هۆی بەرەو پێش چوونی کاری ئاسنگەری لەو ناوچەیە. کوشییەکان لەساڵی ٤٥٠ پ.ز بە دوای ناوچەیەکی ئارامتر دەگەڕان و لەبەر هەندێ بەرەو باشور کۆچیان کرد و "مەروا"یان وەکوو پایتەخت دیاریکرد. "مەروا" لەدەورەبەری رویاری نیل بوو و زەویەکەی زۆر بە پیت بوو. خاکەنازەکانی سەردەمی کوشیەکان لەو ناوچەیە شایەتی ئەوەن کە کاری تواندنەوەی ئاسن چەندە بەرفراوان بووە.

ئامارەکانی شوێنەوارناسی باس لەوە دەکەن کە بۆ ماوەی چەند سەت ساڵێک کوش ناوەندی بەهێزی بازرگانی بووە و لەگەڵ زۆرێک لە وڵاتانی کۆنی جیهان پەیوەندی بازرگانی هەبووە. لە هەندێک لە شوێنەوارەکانی دێرینی کوش کە ئێستا ماون شایەتی لەوە دەدەن کە کوشەکان لە دروستکردنی پەرەستگاو هەرەمەکانیان سوودیان لە شێوازەکانی بیناسازی میسری کۆن وەرگرتووە، هەروەها لە دروستکردنی حەمامەکانیان سوودیان لە شێوازەکانی عەرەبستان و روم وەرگرتووە. وێنەیەک کە لە پاشایەکی کوش لەبەردەستدایە لە سەر پشتی فیلێکە و ئەمەش ڕەنگبێ پەیوەندی نێوان کوش و هیند نیشان بدات، لەبەرئەوەی ناتوانرێت فیلەکانی ئەفریقا وەکوو فیلەکانی هیندستان بۆ سواربوون ڕام بکرێن.

توانای کوش پەیوەست بوو بە هێزی سەربازی و بازرگانیەکەیەوە. هێزی سەربازییەکەی بە هۆی دەستڕاگەیشتنی بە کاری تواندنەوەی ئاسن بوو کە لە کوش هەیانبوو و بە باش سوود

وەرگرتن لێی لە سەدەی چوارەمی پێش زایینی. کالا بازرگانیەکانی ئەفریقا بریتی بوون لە عاج، زێڕ، ئابنووس(دارێکە چێوەکەی ڕەشە و زۆر قورس و گرانبەهایە)، پێستی ئاژەڵان و کۆیلە لە ڕێگەی کوشەوە بۆ ناوچەکانی دیکە هەناردە دەکران؛ ڕێگەی گواستنەوەی ئەم کالایانە لە ڕێگەی کوشەوە دەگواسترانەوە بۆ دۆڵی نیل و میسر و ناوچەکانی دیکەی دەوروبەری مەدیتەرانە  بە هۆی بە هێزی "شانشینی ئاکسوم" کە کەوتبووە بەرزاییەکانی ئەتیۆپیا و باشوری کوش، دەسەلاتی کوش بەرەو لاوازی چوو و کەوتە ژێر دەسەلاتی ئاکسۆمەوە. فەرمانڕەواکانی ئاکسۆم لە ڕێگای دەریای سوور لە عەربستانەوە هاتنە ئەم ناوچەیە و دەسەلاتیان پەرەی سەند، هێزی ئەوانیش هەر بازرگانی بوو، هۆکاری هێرش کردنە سەر کوشیش هەر بە هۆی بەرفراوانبوونی کێبرکێی بازرگانی بوو. لە ساڵی ٣٥٠ز پاشا "ئازانا" فەرمانڕەوای ئاکسوم لە دوای کێبرکێیەکی زۆر لەگەڵ کوش سەرنجام سوپایەکی گەورەی بۆ کوش نارد و دەستی بەسەر مەروادا گرت. بەم سەرکەوتنەش ئاکسۆم جێگای کوشی گرتەوە و زۆری پێ نەچوو کە ئاکسۆم دینی مەسیحی وەرگرت و ئاکسۆم بە شێوەی فەرمی بوو بە وڵاتێکی مەسیحی و لەدوای ئەوە مەسیحیەکان لە بەرزاییەکانی ئەتیۆپیاوە فەرمانڕەواییان کرد.

## سەرچاوە مێژوویەکانی ئەفریقای کۆن

خەڵکانی باشوری بیابانی "سەحرا" پەیوەستن بە دوو گروپی گەورەوە: هەوەڵ خەڵکانی ئەفریقای رۆژئاوا کە لە کەمەربەندە گەورەکان دەژیان و ئەو ناوچانەش داروەدەوەنی کەم بوو. دووهەم خەڵکانی ئەفریقای ناوەڕاست، و ڕژهەلات و باشور بوون، کە زۆربەیان بە زمانی "بانتۆ" قسەیان دەکرد. چیرۆکە نەنوسراوە زارەکیەکانی بانتۆیەکان، زانیاری زۆرمان لە بارەی مێژووی ئەفریقاوە پێدەڵێن. بە هۆی بەراوەردکردنی ئەم ئەفسانە و چیرۆکانە زۆر لە ڕووداوە مێژوویەکانی ئەفریقا ڕوون دەبنەوە. لێکۆڵینەوە زماننسایەکان و دیالێکتناسەکان ئەوەمان لۆ دەگێرنەوە کە بە درێژایی

زۆرێك لە بەروبومە رووەكیەكان لەوانە مۆز، پەتاتەی شیرین، نارگیل و زوڕات لە سەرزوی وڵاتانی دیكەوە بۆ ئەفریقا هاتوون.

٢٠٠٠ ساڵ، ٣٠٠ دیالێکتی زمانی پانتۆ کە ئێستا لە ئەفریقا هەیە لە یەک زمان هەڵهێنجراون، و جیاوازی ئەم دیالێکتانەش بە هۆی ماوەیەکی زۆری لێکدوور بونەوەی ئەو خەڵکەیە. ڕووەکناسەکان لەو باوەڕەدان کە زۆربەی بەروبوومە کشتوکاڵیەکانی ئێستا کە لە ئەفریقا دەڕوێن لە کیشوەرکانی دیکەوە هێنراون بۆ ئەوێ. لەوانە مۆز و پەتاتەی شیرین کە لە ئاسیا لە لایەن بازرگانە ئەندەنوزیەکانەوە لە دەورەبەری ٤٠٠ی زایینی هێنراون بۆ ئەفریقا. بە بێ ئەم بەروبوومە و گەشەی کشتوکاڵی، ژمارەیەکی زۆری خەڵکی ئەفریقا لە ناوچە شێدار و باراناوییەکان نەیاندەتوانی زیندوو بمێننەوە. بەشێکی گەورەی مێژووی ئەفریقا لە ئامارە شوێنەوارناسیەکاندا ڕوون دەبێتەوە، کە ئەویش پشتی بەستووە بە چۆنیەتی گەشەی سوود وەرگرتن لە ئاسن و گۆزەگەری و ئەدەبیاتی زارەکی. ئەو خەڵکانەی کە زمانی نووسینیان نییە، مێژووی خۆیان لەسەر شێوەی چیرۆک و گێرانەوە لەبەردەکەن و پشتاوپشت بۆ یەکتری دەگێڕنەوە و بەم شێوە دەیپارێزن. ئەفریقا تا ماوەیەک لەمەوبەریش سودی لەم ڕێگایە وەردەگرت. بەشێکی دیکەی زانیاریەکان لە بارەی ئەفریقاوە بە هۆی چیرۆک و شیعری بەندبێژ و سرودخوێنانی دەرباری فەرمانڕەوایانی ئەفریقاوە بەدەستمان گەیشتوون.

بەم شێوەیە بەشێکی زۆری مێژووی ئەفریقا لە سەرچاوەی ناڕاستەوخۆ بەدەستگەیشتوون و تەنیا ژمارەیەکی کەم لە ئەفریقیەکان بەڵگەی نوسراویان لە دوای خۆیان جێهێشتووە. لەگەڵ هەموو ئەمانەش، زۆرێک لە بێگانەگان و گەشتیارەکان کە گەشتی ئەوێیان کردووە، کاری گەورەیان لە بواری مێژووی ئەفریقاوە کردووە، بۆ وێنە "هرودوت"، مێژوونووسی یونان.

یونانیەکی دیکەش لەساڵی ١٢٠ی زایینی ڕێنمایی بۆ گەشت کردن بە دەریایی سووردا و ڕۆشتن بۆ کەناراوەکانی باکووری ئەفریقای لە دوای خۆی بەجێهێشتووە.

زۆربەی زانیاریە راستەوخۆیەکانی ئێمە لە بارەی ئەفریقای باشوور بە هۆی راپۆرتی نووسەران و گەشتیارانی عەرەب و موسڵمانانی ئەفریقاییە. ئەم چەشنە لە نووسین لە سەدەی دەهەمی زایینی برەوی پێدرا و لە سەدەی پانزەش گەشتیاران و بازرگانانی پورتوگالی ئەم کارەیان ئەنجامدا. زانیارییەکانی دیکەی ئێمە لە ڕێگەی نووسینەکانی عەرەبی و سواحیلییەوەیە کە لە سەدەی شانزەهەم برەوی پەیدا کرد. (سواحلی: خەڵکانی سواحلی لە ناوچە کەناراوەکان و دورگەکانی کینیا و تانزانیا دەژین.) ئایینی ئەم خەڵکە ئیسلامە و کەوتونەتە ژێر کاریگەری فەرهەنگی ئیسلامییەوە. ئەم خەڵکە لەگەڵ بازرگانە عەرەبەکان پەیوەندییان هەبووە و زۆرێک لە شارە کۆنەکانی ئەفریقای وەکوو "کیلوا مومبازا" و "باکامایۆ" لە لایەن ئەوانەوە بونیاد نرا. زمانەکەشیان هەر بە سواحلی ناسراوە.

## غانا/گانا، مالی و سۆنگای دێرین: سێ ئیمپراتۆریەتی دێرینی ئەفریقا

پەیکەرێك لە شارستانیەتی نووك کە دەگەڕێتەوە بۆ 2000 پ.ز

لەگەڵ تێکشکانی "کوش" لە "ئاکسوم" لە دەوروبەری ٣٥٠ز ڕەنگبێ هەندێک لە خەڵکی "کوش" لە ترسی زیان پێگەیشتنیان لە لایەن ئاکسومەکانەوە بەرەو ڕۆژئاوا و زەوییە کەم درەختەکانی نزیک دەریاچەی "چاد" هەڵاتبن. شێوازی حکومەتی شانشینی و ئیمپراتۆریەتی ئەفریقا ڕەنگبێ لە بیرۆکەکانی کوشیەوە وەرگیرابێ، لەبەرئەوەی ئەم شێوازە حکومەتکردنە لە ساڵی 400ز بەم لاوە سەریهەڵداوە.

گواستنەوەی کاڵا بە وشتر لە بیابان

زۆرێک لە بازرگانەکان لە زووەوە ئاشنایەتییان لەگەڵ ڕێگا بازرگانییەکانی ئەم ناوچانەدا هەبوو و هەندێکیشیان ڕێگای تاقەتپڕوکێنی سەحرایان دەگرتە بەر. دەگوترێت ڕەنگە ئاشنایی سودانی ڕۆژئاوا بە کاری کشتوکاڵ لە ڕێگەی زانیاریەکانی گەشتیارانی ئەو ڕێگایانەوە بووبێت، بەڵام گەشە نەکردنی چاندنی برنج، هەرزن سۆرگوم لە ئەفریقای رۆژهەلات پاڵپشتی ئەم بۆچوونە ناکات. لە ناوچە دارستاناوییەکانی باشور خەڵک سەرقاڵی چاندنی بەروبومێک بوون کە لەگەڵ کەش و هەوای ناوچەکە سازگاری هەبوو.

چەندین سەدە بەر لە پەیدابوونی دەسەڵاتە شانشینەکان لەم ناوچانە، خەڵکی ئەم ناوچانە سەرقاڵی کاری کشتوکاڵی بوون، هەروەها کارمەیشییان لە کاری هونەر و پەیکەرتاشی هەبوو. هونەرمەندانی ئەم سەرزەوییە پەیکەرەکانیان لە گڵ دروست دەکرد و ئەم پەیکەرانە بە جۆرێک پەیوەندی بە پەرستشی باوباپیرانیانەوە هەبووە. هەوەڵین نمونەی ئەم پەیکەرانە لە نزیک گوندی "نوک" لە نێجیریا دۆزراونەتەوە و هەر لەبەر هەندێشە کە بە پەیکەرەکانی دیکەی هاوشێوە دەوترێت "پەیکەری نوک".

کاتێ مێژوونووسە عەرەبەکان مێژووی ئەم سەرزەوییەیان دەنووسیەوە، ئەوەڵین دەسەڵاتی پاشایەتی ئەم ناوچەیە واتە ئیمپراتۆریەتی غانا دەسەڵاتی گرتبووە دەست.

هۆکاری گرتنە دەسەڵاتی ئەم ئیمپراتۆریەتە خۆی لە دوو خاڵدا دەبینێتەوە: یەکەم جێگیربوونی ئەم ئیمپراتۆریەتە لە کۆتاییەکانی ڕێگا بازرگانیەکان کە لە بیابانەوە تێدەپەڕی و ئیمپراتۆریەتی غانا بە هۆی کۆنترۆڵ کردنی ئەم ڕێگایانە و وەرگرتنی باج، سامانێکی زۆری کۆکردەوە. دووەم، پڕچەک بوونی سوپاکەی بە چەکی ئاسنی

کەعبەی پیرۆز لە شاری مەککە

چەندین سەدە ڕێگە بازرگانییەکانی بیابان سوودی لێوەردەگیرا و بومییەکانی ئەم ناوچانە بە وەرگرتنی بیرۆکەی بەکارهێنانی وشتر لە بیابان کە لە عەرەبەکانەوە فێری ببون، کاری خۆیان ڕادەپەڕاند. کاڵا بازرگانیەکانی ئەو سەردمە٤٠٠ی.ز بریتیی بوون لە (خوێ و زێڕ). لە سودانی ڕۆژئاوا خوێ دەگمەن بوو لە کاتێکدا خوێ لە سەحرا و ناوچەکانی باکوور زۆر بوو. زێڕیش لە هەندێک لە ناوچەکانی ڕۆژئاوای ئەفریقا دەستدەکەوت و لە سەدەی حەوتی میلادی داواکاری بازرگانە موسڵمانەکان بۆ بازرگانی زێڕ ڕووی لە زیادبوون کرد. بازرگانە عەرەبەکان گەورەترین بازرگانانی ئەم ناوچانە بوون و زۆرێک لە نووسەرە عەرەبەکان زانیارییان بە بازرگانەکان دەدا و بازرگانی زێڕیش لەو سەردەمە زیاتر لە ڕێگەی ئاڵوگۆڕکردنی کاڵا بەرامبەر کاڵا بووە. پاشای غانا باجی دەخستە

وێنەی مەنساموسا ئیمپراتۆری مالی. ئیمپراتۆر پارچە بەردێکی ئاڵتونی بەدەستەوەیە. ئەم نەخشەیە جوگرافیازانێکی سپانی لە ساڵی 1375 کێشاویەتی.

پەیکەری سەری ئانی (پاشا) لە سەدەی سێزدە دروستکراوە.

سەر هەر کاڵایەک کە هاوردە کرابا یان هەناردە کرابا و لەم ڕێگەیەوە خەرجی دەرباری خۆی دەستەبەر دەکرد. گەرچی زۆربەی ئەو بازرگانانەی دەهاتنە ئەم ناوچانە عەرەب و موسڵمان بوون، بەڵام دەربار و خەڵکی غانا دینی ناوچەیی خۆیان پاراست و ئەمەش دەکرێ لە شێوازی بەخاک ئەسپاردنی مردووەکانیان کە لە سەر شێوازی میسری کۆن بوو، ببینرێ.

لە ساڵی ١٢٤٠ز فەرمانڕەوای غانا لە دوای چەند سەد ساڵ، هێزی خۆی لە بەرامبەر وڵاتێکی بچوکی " مالی" لەدەستدا. کۆنترۆڵی ڕێگا گرنگە بازرگانیەکان لە لایەن " سوندیاتا" پاشای مالییەوە دەستی بەسەرداگیرا. ٢٠٠ ساڵ دواتر لە ساڵی ١٤٦٠ز ئەم دەسەڵاتە هەر لەبەر ئەم هۆکارانە گواسترایەوە بۆ "سەنی عەلی" پاشای "سۆنگا". سۆنگای چەند سەد میلێک لە مالییەوە دوور بوو و کەوتبووە دامێنی ڕووباری نێجیریا. هۆکاری سەرکەوتنی "سەنی عەلی" جگە لە هێزی بازرگانی سۆنگای، لە بواری جەنگ و ڕێکخراوەیی سوپاکەشیەوە لە پێشتر بوو و بەم پێیە بوو کە سەنی عەلی توانی ئیمپراتۆریەتی سۆنگا دامەزرێنێ.

ئیمپراتۆریەتی سۆنگای لە ئیمپراتۆریەتی غانا گەورەتر، دەوڵەمەنتر و بەهێزتریش بوو. بە هۆی گێڕانەوەکانی "ئیبن بەتتوتە" یەکێک لە هۆکارەکانی ڕوخانی مالی، گەندەڵی و فەسادی نێو دەرباری مالی بوو. لەگەڵ هەموو ئەمانە، دوای بەدەستهێنانی دەسەڵات لە لایەن سۆنگای، مالی تا ڕادەیەک هێزی سەربازی و بازرگانی خۆی پاراست و لەگەڵ بڵاوبوونەوەی ئاینی ئیسلام لەم ناوچانە، مزگەوتی گەورە بونیاد نرا، وەکوو مزگەوتی "تمبوکتو" و"جن" لە مالی. فەرمانڕەواکانی مالی بۆ زیارەت دەچوونە مەککە مەبەست لە (حەج و عەمرەیە). "مەنساموسا" گەورەترین فەرمانڕەوای مالی لە ( ١٣٠٢ تا ١٣٣٧) لە ساڵی ١٣٢٤ز بۆ زیارەت چوو بۆ مەککە و بە پێی ڕاپۆرتەکان، لەم گەشتەیدا نزیکەی ٥٠٠ خزمەتکاری لەگەڵدا بوو، هەروەها ١٠٠ باری وشتر زێڕ و کاڵای دیکەی پێ بووە. مەنساموسا دوای ئەم گەشتەی ناوبانگی

پەیکەری سەری ئەیوبا (شاژنی دایك) کە لەلایەن هونەرمەندانی بەنین لە سەرەتای سەدەی شانزە سازکراوە.

پلاکاتێکی زیوەری کۆشکی پاشایەتی لە لایەن بەنیەکانەوە دروستکراوە لە شانزەی زایینی.

زۆری دەرکرد و هەتا یەکێک لە جوگرافیناسەکانی ئیسپانیا وێنەی ئەوی لە نەخشەکەیدا کێشابووەوە. ئیبن بەتتوتە لە ساڵی ١٣٥٢ز گەشتێکی کردووە بۆ مالی و زۆر خۆشحاڵی دەربڕیوە لەوەی کە لەوێدا چاوی بە موسڵمانان کەوتووە. لە سەدەی شانزەهەم، مزگەوتەکانی "جن" و "تەمبکتو" بوونە ناوەندی فێرخوازی بەناوبانگ. زۆرێک لە خەڵکی موسڵمانی سەرزەوییەکانی دیکە بۆ فێربوون دەچوونە ئەو فێرگانە واتە لە مزگەوتەکان.

ڕۆژگاری درەوشاوەو هێزی سودانی ڕۆژهەڵاتیش لە ساڵی ١٥٠٩ کۆتایی پێهات و سۆنگای کەوتە ژێر دەسەڵاتی چەکە بەهێزەکانی ڕۆژئاوا. گەرچی سۆنگای تێکڕوخا، بەڵام مەراکش نەیتوانی ئەم ناوچەیە کە هەرچەند لێ شییەوە دوور بوو دەستی بەسەردابگرێت.

## قەڵەمڕەو و پاشایەتی سەرزەویی دارستانی بەنین

نزیکەی چەند سەت ساڵێک بازرگانەکان لە ڕێگەی ئیمپراتۆرەکانی ناوچە کەم درەختەکان لەگەڵ خەڵکی ناوچە دارستانیەکانی باشور پەیوەندییان هەبوو، ئەم پەیوەندییانەش بوونە هۆی سەرەتایەک بۆ سەرهەڵدانی حکومەت لە ناوچە دارستانییەکان. تاکو بەر لەوەی پورتوگالییەکان بێنە ناوچەی کەناراوەکانی "گینە" لە ساڵی ١٤٧٠ز ئێمە زانیارییەکی ئەوتۆمان لەبەردەستدا نییە،

پەیکەرێکی لە عاج دروستکراو لە لایەن هونەرمەندانی بەنین لە سەدەی شانزەهەم

ئەوەی کە دەیزانین، ئەو زانیارییانەن کە لە ئەدەبیاتی زارەکی خەڵکی ناوچەکە دەستمان کەوتوون. "بەنین" بەناوبانگترین و کۆنترین حکومەتی ناوچە دارستاناوییەکان بوو. مێژووی کۆنی "بەنین" دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سەردەمەی کە فەرمانڕەوای "بەنین" بە "ئوبا" بەناوبانگ بووە. بەرهەمە هونەرییەکانی "بەنین" و "ئیفە" ناوبانگێکی مەزنیان هەبوو و ئەم بەرهەمانەش زیاتر پەیکەر بوون کە لەڕێگەی داتاشین و داڕژانی برنج (برنج: کانزایەکە کە لە تێکەڵەی مس و قەڵای دروست دەبێت)، واتە برنجەی تواوە لە جیاتی مۆم بەکاردەهات. هونەرمەندەکانی ئەم ناوچەیە جۆرێک لە پەیکەری گڵییان دروست دەکرد و وشکیان دەکردەوە و چینی سەرەوەیان بە مۆم/شەم دادەپۆشی و ئەو چینی مۆمەشیان بە گوڵی ڕۆز دادەپۆشی. دوای وشک بوونەوەی گوڵی ڕۆزەکە برنجەی تواوەییان دەکردە ناو درزی پەیکەرەکە و بە هۆی توانەوەی مۆمەکە کە پێیان رووپۆش کردبوو، مۆمەکە دەتوایەوە و پەیکەرەکە شکڵی برنجەی بەخۆوە دەگرت. سەرەتای پەیوەندییەکانی ئەورپاییەکان لەگەڵ خەڵکی بەنین دۆستانە بوو و پورتوگالیەکان لەسەر داوای ئوبا کەسانی مەسیحییان دەنارد بۆ بڵاوکردنەوەی دینی مەسیحی لەناوچەکە.

بازرگانەکانی بەنین کەسانی بەسرنج بوون و ئەوروپییەکان و لێکۆڵەرەکان لە شکۆ و رازەوەیی کۆشکی پاشایەتی سەریان سوڕمابوو. دیوارەکانی کۆشکی پاشایەتی هەمووی بە تابلۆی برۆنزی

کۆیلەکە بەدیلگیراوەکان بەرەو کەناراوەکان دەبردرێن

داپۆشرابوون کە باسی لە مێژووی ڕابردووی "بەنین" دەکرد. هونەرمەندانی بەنین، پەیکەرو نەخش ونیگاری رازاوەیان لە عاج دروست دەکرد. پوکانەوەی دەسەڵاتی بەنین هاوکات بوو لەگەڵ بەرفراوان بوونی بازرگانی کۆیلە.

*بۆ زانیاری زایاتر بگەڕێوە بۆ ناملیکەی بازرگانی کۆیلە لەم زنجیرەیەدا.*

## قەڵەمڕەو و پاشایەتی کۆنگۆ

ڕێگاو سەرچاوە بازرگانیەکانی زەریای هیندی

هەوەڵین کەشتی پورتوگالییەکان لە ساڵی ١٨٤٢ز لە کەناراوەکانی کەنداوی کۆنگۆ لەنگەری گرت و سێ ساڵ دواتر دووهەمین کەشتیان لە ناوچەیەکی سەروتر لە قەڵەمڕەو و پاشایەتیەک لەنگەری گرت کە قەڵەمڕەوی کۆنگۆ بوو. پاشایەتی کۆنگۆ کەوتبووە باشووری رووباری کۆنگۆ و پاشاکەشیان بە "مانی کۆنگۆ" بەناوبانگ بوو. هەر وەکوو "بەنین" پورتوگالیەکان لە سەرەتادا

ڕەفتارییان لەگەڵ ئەمانیش باش بوو و خێرا دەستیان کرد بە ناردنی بانگخوازی مەسیحی بۆ ناوچەکە و کەلیساشیان لێ دروست کرد.

قەڵای عیسا لە مومبازا لە لایەن پورتوگالیەکانەوە لە ساڵی 1593دروستکرا

ساڵی ١٥٠٧ "مانی کۆنگۆ"یەکی دیکە هاتە سەر تەختی پاشایەتی و خۆی لە ئاودا شوشت و بوو بە مەسیحی و ناوی خۆشی گۆڕی بوو "ئافۆنسۆ" کە ناوێکی مەسیحی بوو. ئیتر ئەوکات پورتوگال لە دوو دورگەی باکوری کەنداوی کۆنگۆ دەستی کرد بە کاری کشتوکاڵ. هەروەها کۆیلەشی بۆ کارکردن لەم زەوییانەو بۆ موستەعمەرەکانی بەرزایلیش هەر لە کۆنگو دەستەبەر دەکرد. داواکاری بۆ کۆیلە لە ئەوروپا و موستەعمەرەکانیان ڕووی لە هەڵکشان کرد و ئیتر پورتوگالییەکان لە سەرانسەری زەریای ئەتڵەسی دەستیان کردە یەخسیرکردنی خەڵکی وەکوو کۆیلە. لە ساڵی ١٥٢٦ز "ئافۆنسۆ" هەستی بەوە کرد کە بازرگانی کۆیلە بووەتە هۆی لەناوبردنی کۆنگۆ و کەم بوونەوی خەڵک لە باشترین ژنان و پیاوان؛ بازرگانە پورتوگالییەکان هیچ گوێیان بە فەرمان و یاساکانی ئەو نەدەدا و بە ئاسانی هەموو شتێکیان پێشێل دەکرد، تا ئەوەی کە "ئافۆنسۆ" نامەیەکی بۆ پاشای پورتوگال نووسی و داوای لێکرد کە بازرگانی کۆیلە لە قەڵەمڕەوەکەی بوەستێنێت کە بووەتە هۆی نابودی وڵاتەکەی. لە ساڵی ١٥٤٥ز لە دوای مردنی

"ئافۆنسۆ" سەرەنجام پشێوی کەوتە ناو کۆنگۆ و شۆڕش لە دژی پورتوگالییەکان دەستی پێکرد. دەوڵەتی پورتوگال ناچار بوو بۆ یەخسیرکردنی کۆیلە ڕوو بکاتە باشوری کۆنگۆ واتە "ئانگۆلا".

نەخشەیەك کە پورتوگالیەکان لەسەر دورگەی مومبازابان کێشاوە

## بەندەرە بازرگانییەکانی ئەفریقای ڕۆژهەڵات

مزگەوتی گەورەی کیلوا . لە سەدەی سێزدە دروستکراوە

لە ساڵی ١٤٨٩ "واسگودوگاما" دەریاوان و گەشتیاری پورتوگالی ڕێگایەکی نوێی بۆ تێپەڕین لە لوتکەی "ئومیدنیک" بۆ کەناراوەکانی ئەفریقای ڕۆژهەڵات دۆزییەوە. "واسکۆدوگاما" لە گەشتەکەیدا ئاشنایەتی لەگەڵ ناوچە ئاوەدانەکان پەیداکرد کە خەڵکەکەی لە زەریای هیندی لە "دورگەی بەهارات" تایلەند و چین و سەرزەوییەکانی دیکە خەریکی بازرگانی بوون و بازرگانییەکانی ئەم بەندەرانەش زیاتر لە لایەن بازرگانە موسڵمانەکان بەڕێوە دەچوو.

غوراب یان ذوقلع، جۆرێك لە كەشتی بازرگانە عەرەبەكان. ئەم جۆرە كەشتیانە چەندین سەدە لە ئەفریقای رۆژهەڵات و زەریای هیندی كەڵکی لێ وەردەگیرا

لە "مالیندا" پێشوازییەکی گەرمییان لە "واسکودوگاما" کرد و ڕێنماییان کرد بۆ ئەوەی خۆی بگەیەنێتە بەندەرەکانی هیندی ڕۆژئاوا. کاتێک "واسکودوگاما" گەڕایەوە پورتوگال، پاشای پورتوگالی لە ناز و نیعمەتەکانی ئەو بەندەرانە ئاگادار کردەوە و داوای لە پاشا کرد کە بۆ ئەوەی بتوانێ دەست بە سەر زەریای هیندیدا بگرێت دەتوانێ شارەکان و بەندەرەکانیان داگیر بکات. (بگەڕێوە بۆ بەهارات و شارستانییەتەکان لەم زنجیرەیە)

لەساڵی ١٥٠٩ پورتوگالیەکان بە پشت بەستن بە کەشتی جەنگی و بازرگانی، چەکی پێشکەوتوو و سەربازانی لێهاتوو، ڕیزەکانی سەربازان و خەڵکی ئەفریقایان تێکشکاند و شارە گەورەکان و ناوچە ئاوەدانەکانی وەکوو "کیلوا" و "مومبازا"یان تاڵان و خاپوور کرد. سەرکەوتنی خێرای پورتوگالییەکان، بەردێکی گەورەی لەسەر ڕێگای پێشکەوتن و سەربەخۆیی ئەو بەندەرانەدا دانا. میسریەکان، عەرەبەکان و یۆنانیەکان لە ساڵەکانی پێش زایینیەوە هاتبوونە ئەم ناوچانە، بەڵام گرنگیدان بەم بەندەرانە یەکەم جار لە ساڵی ٧٠٠ز و لەلایەن عەرەبە موسڵمانەکانەوە بوو، ئەوانیش لەو بەندەرانە مانەوە و ژن و ژنخوازییان لەگەڵ خەڵکی ئەو ناوچانە دەستپێکرد و بە پێی تێپەڕینی کات، زمان و فەرهەنگێکی نوێ لەو ناوچانەدا سەریهەڵدا. گەرچی عەرەبەکان لەگەڵ

پەرەستگای هاوسێ لە کۆشکی پاشایەتی زیمبابوە

بومییەکانی(خەڵکی ناوچەیی) ئەم ناوچانە بە زمانی "سواحیلی" قسەیان دەکرد، بەڵام ئەم شارستانیەتە هیچ کاتێک یەکی نەگرت و هەر بەندەر و ناوچەیەک فەرمانڕەوای خۆی هەبوو، کە زۆربەیان بە عەرەبی یان سواحیلی قسەیان دەکرد و لە یەکتر جودا بوون. لە ساڵی ١١٠٠ز بەدواوە ڕێژەی عەرەبەکان لە زەریای هیندی ڕووی لە زیاد بوون کرد و مزگەوت و ئاوەدانیان لێ دروست کرد. مزگەوتی"کیلوا" یەکێکە لەو مزگەوتە شکۆمەندانە. کاتێک "ئیبن بەتتوتە" لە ساڵی ١٣١٣ رووی کردە "کیلوا" زۆر خۆشحاڵ بوو کاتێ بینی ئایینی ئیسلام لەم ناوچەیە پێشڕەوی بەرچاوی بەخۆیەوە دیوە. لە گەشتنامەکەیدا بە شکۆوە باس لە جوانی کیلوا و بەلەزەتی خۆراک و ڕازاوەیی جلو بەرگەکانیان دەکات.

لەو سەردەمەدا، کیلوا دەوڵەمەنترین و بەهێزترین وڵاتی کەناراوەکانی ڕۆژهەڵاتی ئەفریقا بوو و کەشتیەکانی ئێران و هیندستان بۆ کاری بازرگانی لەم بەندەرانە چالاک بوون. کەشتی چارۆکەدار

قەڵای جەنگی لە زیمبابوە

به ئاستەم دەیتوانی لە کیلوا دوورکەویتەوە، چونکە بە هۆی نەمانی کژەبا ئاستەم دەبوو ئەو کەشتیانە بگەڕێنەوە بۆ وڵاتانی خۆیان، واتە کژەبا هەلی بۆ گەشتەکانی ئەوان دەرەخساند. کەشتی عەرەبەکان کە ناسرابوو بە "زوقەلع" یان "غوراب" لە کاتی گەڕانەوەیان لە "سوفالا" بە ناچاری لە بەندەرەکانی کیلوا لەنگەریان دەبەست و فەرمانڕەواکانی کیلواش باجیان لەو بازرگانانە وەردەگرت کە دەهاتنە ئەو بەندەرانەوە. لە گێڕانەوە و راپۆرتی گەشتیار و نووسەرانی عەرەب و پورتوگالی و ئامارەکانی شوێنەوارناسی باس لە سکە و گۆزەگەری و سەروەت و شکۆمەندی شارەکانی ئەو ناوچەیە دەکەن. ( هەڵبەت بەر لە خاپور کردنیان!)

## "قەڵمڕەو و پاشایەتی "مونوموپاتا

بازرگانیی زێڕ لە "سوفالا" و "کیلوا" بیری بەڕیوەبردنی بازرگانی ئەم ناوچانەی خستە مێشکی پورتوگالییەکان. پورتوگالییەکان شوێنی کانەکانی زێڕ لە عەرەبەکانەوە فێربوون، کە ئەو کانانە کەوتبوونە فەرمانڕەوایی "مونوموتاپا". پاشایەتی "مونوموتاپا" کە ئەمڕۆ پێی دەڵێن "رودزیا" لە سەرەتای سەدەی پانزەهەم کەوتبووە ژێر فەرمانڕەوایی "مونوموتاپا"وە کە پایتەختەکەی لە "زیمبابوە" بووە. "زیمبابوە" لە دوو بەشی لێک جیا پێکهاتبوو کە ١کم لەیەکتر دوور بوون. ئەم دوو بەشەش پەرەستگا و دژ/قەڵای سەربازی لەخۆدەگرت. پاشماوەی ئەو پەرستگایە کە ماوە شێوەکەی هێلکەییە، روبەرەکەی ٣٠٠*٢٠٠ پێ دەبێ و بەرزی دیوارەکەشی ٣٠ پێ بەرزە. لەو دەوروبەرە پاشماوەی چەند بینایەک دەبینرێ و لەوانە کۆشکی پاشایەتی، حەرەمسەرا، شوێنی نیشتەجێ بوونی خێزانی پاشا و تاوەرێکی قوچەکی. قەڵای سەربازی لەبەرد دروستکراوی ئەو ناوچەیە لەسەر بەردی زەبلاح بونیاد نراوە کە ١کم لە پەرەستگاکە دوورە و دیوارەکانیشی لە کێلەبەردی زەبەلاح دروستکراون. ئەم بینایانە لە سەدەی ١٢ی زایینی دروستکراون ، بەڵام هەندێک بەشی لەوانە دیواری پەرەستگا و تاوەرەکە لە سەدەی حەوتی زایینی دروستکراون.

له "زیمبابوه"، پاشای مونوپاتایان وەکوو خودا چاو لێ دەکرد، رەعیەتەکانی تەنها لە پشت پەردەوە یان لە پشت دیوارێکەوە دەیانتوانی قسەی لەگەڵ بکەن. لە کاتی نەخۆشی و بێ توانایی پاشا، دانیشتوانی زیمبابوە چاوەڕوانی ئەوەیان دەکرد کە پاشا خۆی بکوژێ و دەسەڵات بۆ پاشای گەنج و بە توانای دوای خۆی جێبهێڵێت. لە کۆشکی پاشایەتی بابەتی زاڵ بوون و شایستەیی ئەمیرێک بەسەر ئەوی تردا  هەمیشە لە ئارادا بوو، ئاگرێک بوو کە هەمیشە گڕی دەگرت، و ئەم گڕەش تەنها بە مەرگی مونوموتاپا یان رودزیا خامۆش دەبوو. کلتوریان بەو جۆرە بوو کە هەموو ساڵێک لە سەروبەندی ساڵی نوێ رەعیەتەکان و ئەمیرەکان روناکی ماڵەکانی خۆیان و کۆشکیشیان دەکوژاندنەوە، و بە نیشانەی پەیڕەوی و گوێڕایەڵی لە مونوموتاپای داوتر جارێکی دیکە ڕوناکی ماڵەکانیان لەگەڵ ڕوناکی کۆشک هەڵدەکردەوە.

بەر لە هێرشی پورتوگالیەکان بۆ ئەم سەرزەویە، فەرمانڕەوای "چانگامیر" دەسەڵاتی بەسەر کانە زێڕەکانی مونوموتاپادا هەبوو و قەڵمڕەوی فەرمانڕەوایی مونوموتاپای گواستەوە بۆ بەشی باکوری دەسەڵاتەکەی پێشتری خۆی، واتە "زتمبزی" و پورتوگالیەکان هیچ کات نەیانتوانی دەست بەسەر ئەو کانانەدا بگرن. لە ساڵی ١٦٢٩ پورتوگالیەکان توانیان کەسێک بە ناوی "ماوورا" بە پلەی مونوموتاپای لە "زامبزی" دیاری بکەن و بە پێی گرێبەست لەگەڵ "ماوورا" پورتوگال لەوێ دەستکەوتێکی چاکی کۆکردەوە. عەرەبەکان، خەڵکی بەندەرەکان، خەڵکی کەناراوەکان و ئەفریقاییەکان هەموویان ڕقیان لە پورتوگالییەکان دەبووەوە، هەر لەبەرهەندێ کەم کەم بە ئاگاهاتنەو و لە دژی پورتوگال دەستیان کردە شۆڕش. بازرگانی ئەو رەونەقەی پێشتری نەما و لە کۆتاییدا لە ساڵی ١٦٩٨ز پورتوکال ناچار بوو لە " موزامبیک"یش بچێتە دەرێ. تەنیا سوودی پورتوگالیەکان بۆ ئەفریقیەکان، چاندنی زەڕات و کاسا و پەتاتەی شیرین بوو، باقی کارەکانی دیکەیان جگە لە تالان و وێرانکاری، چیدی نەبووە.

# گرنگی مێژووی ئەفریقای دێرین

لەم نامیلکەیەدا بە کورتی باسمان لە بەشێکی بچوکی مێژووی کۆنی ئەفریقا و پاشاکانی کرد. هەر ڕۆژەو گۆشەیەکی نوێی مێژووی ئەم کیشوەرە دەخرێتە بەر لێکۆڵینەو و پاشاگەلێکی تر هەن کە باس نەکراون، باس دەکرێن. لەم نامیلکە بچوکەدا لە گەڵ جوگرافیا، ئاوهەوا، کشتوکاڵ، کانە ئاسنەکان و سوود لێ وەرگرتنیان، تایبەتمەندی کشتوکاڵ لە ناوچەکە، گەشەی دانیشتوان و ڕێکخراوی هەندێ لە وڵاتان ئاشنا بووین، کە چلۆن فەرمانڕەوا بەهێزەکان بە هۆی گۆڕانی بارودۆخ ڕوویان لە پوکانەوە کرد، هەروەها بینیمان کە چۆن وەستانی پێشکەوتنی هەندێ ناوچەی ئەفریقا بە هۆی تەماح و ستەمکاریی داگیرکاران بەرامبەر خەڵکی ئەو ناوچانە بووە.

یەکێک لە هەوەڵین فەرماندەکانی موستەعمەراتی بەریتانیا لە ئەفریقای ڕۆژهەڵات دەیگوت: " ئێمە ئەفریقای ڕۆژهەڵات ناناسین و تەجرەبەی کەممان لێی هەیە... ئێرە سەرزەوییەکەی دەستنەخواردووە کە دەتوانرێ هەر کارێکی تێدا بکرێ!"

ڕێبەرانی ئەو وڵاتانەی کە تازە سەربەخۆییان وەرگرتووە، ئێستا دەزانن کە بە سرنجدان بە ڕابردووی ئەم کیشوەرە و کێشەکانی کە خەڵکی پێوەی گیرۆدە بوون، دەتواندرێت داهاتویەکی ڕۆشن بۆ ئەفریقا بونیاد بنرێت.